نــــاوی نامیلـکه : کلیلەکانی سەرکەوتن

ئــامادەکــردنــی : شکریە شێخانی

پێداچونــەوەی : دەستەیەك لە ئینستوێتی بانگخوازان

تـــــایـــپ : راوێژ سعید

دیزاینی بــەرگ : علی گەردی

دیزاینی ناوەوە : راستی سعید

تـــیراژ : ٢٠٠٠ دانە

شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی

( ١٥٧ )ی سالی ٢٠١٦ی پێ دراوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ
وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ
وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾

التوبة

## پێشەكی:

دیارە تێپەڕاندنی قۆناغەكانی خوێندن بە سەركەوتویی پێویستی بە هەوڵ و تێكۆشان و لە خۆ بوردەی زۆر هەیە، ئاشكرایە قۆناغەكان جیاوازن، هەڵبەتە تێپەڕاندنی قۆناغەكانیش بەشێوەیەكی دروست پێویستی بە كۆمەڵێك بنەما و رێنمایی و ئامۆژگاری هەیە، قۆناغی زانكۆ و پەیمانگاش جیا لە قۆناغەكانی تر كەش وهەوایەكی جیاوازی هەیە .

كاتێك ئێمە لە سەرەتای چونمان بۆ زانكۆ نەماندەزانی چۆن مامەڵە بكەین، ئامۆژگاری جیا و دژ بەیەكمان دەبیست هەندیك جاریش راوێژمان بە خوێندكارانی یەك دوو قۆناغی پێش خۆمان دەكرد رەنگە هەڵسوكەوت و مامەڵەمان وەكوو پێویست نەبوبێت، ئێستا هیوا خوازین بەشێك لەم یادەوەریانە لە زهن و بیرەوەری مامۆستا و هاوڕێكا نمان بسڕێتەوە .

بۆیە بە پێویستمان زانی ئەم کۆمەڵە ئامۆژگاری و ڕێنماییانە بخەینە بەردەست ئەو خوێندکارانەی کە سەرەتای دەست پێکردنیانە بە پرۆسەی خوێندن لە زانکۆ و پەیمانگاکان ،هەڵبەتە ئەم ڕێنمایی و ئامۆژگاریانە هەڵێنجاوی پەیامی خوای گەورە و پیغەمبەری ئازیزمانە ( درود و سڵای خوای گەورەی لێبێت ) پیادەکردنیان مایەی سەرکەوتن و بەختەوەری و سەرفرازیە لە ژیانی ئێستا و دوارۆژمان.

شکریە شێخانی

خوێندن و فێر بوون و درێژه دان بەم پرۆسە گرنگە پەرستشتێکە و پاداشتەکەی بریتیە لە دەستەبەرکردنی ڕەزامەندی پەروەردگار و بەهەشتی نەبڕاوە .

بەڵام ئەم ڕێگایە پێوستی بەگرتنەبەری کۆمەڵێك ئاداب و ڕەوشت و ئاکاری جوان و بنەما هەیە بۆئەوەی بتوانین بچینە نێو کەشتیەکەی نوح و بەرەو لێواری ئەمانمان ببا ئەوسا بەرەو شاری بەهەشت ومۆری مانەوەی هەتا هەتا مسۆگەر دەکەین ئەو هۆکارانەش :

١ - ڕازو نیاز( نیەتت ) تەنها بۆ خوا بێت، نیەت پاکی وخۆیەکلایی کردنەوە بۆخوای باڵا دەست هۆکاری سەرەکیە بۆ دەستەبەر کردنی پاداشت و ڕەزامەندی پەروەردگار،ئەوەتا عومەری کوری خەتاب( خوا لێی ڕازی بێت ) لە پێغەمبەری خوا ( درود و سڵاوی خوای لێ بێت )( دەگێڕێتەوە کە دەفەرمووێت ) {إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى} . ( رواه البخاري و مسلم ) واتە :هەموو کارو کردەوەیەك بە ڕاز و نیاز و نییەتی

خاوەنەکەیەتی،وەپاداشتی هەرکەسێك بەپێی جۆری نییەتەکەیەتی.

٢- دیاری کردنی ئامانج:بوونی ئامانجی گەورە و گرنگ، هۆکارێکی گرنگە بۆ سەرکەوتن و زاڵ بوون بەسەر کۆسپ و تەگەرەکان، مرۆڤی ژیر پێوستە هیوا و ئامانجەکانی بەقەد ئەستێرەکان بەرز بن .

٣- هەوڵ و کۆشش و شەونخونی بەردەوام : کارکردن و هەوڵ تێکۆشانی بەردەوام و بەرهەمی شیرین بەدوای خۆیدا دەهێنێت خوای گەورە لە سورەتی التوبة دەفەرمووێت {وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَي اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَي عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿105﴾} واتە: کار بکەن و هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوامتان هەبێت خوا و پێغەمبەر و بڕواداران کارەکانتان دەبینن،وە پاشان دەگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارێك کە ئاگاداری هەموو کارێکی ئاشکرا و نهێنییە، ئاگادارتان دەکاتەوە لەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامتان داوە.

٤- پەیوەست بوون بەکۆمەڵێك ئاداب و ڕەوشت و ئاکاری بەرزو جوان، بەڵکو پێویستە قورئانێکی وەرگێردراو بین بەڕەوشت و ئاکارە جوانەکانمان جوانی و بەرزی ئیسلام نیشانی خەڵك بدەین وەك پێشەنگ و سەروەرمان (کان قرآناً یمشي بین الناس)، هەمیشە هاوپۆلەکانمان بەچاوی پێشەنگ و ڕێز سەیرمان بکەن ، لە پێناو دەستەبەرکردنی هاوسێیەتی و نزیکیمان لە پێغەمبەری خوا لەڕۆژی دوایی.

لە گرنگترین ئاداب و ڕەوشت و ئاکارە جوانەکان :

١- نەرمی و لەسەرخۆیی: پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت )بە ئەشەجی کوری عبدالقیسی( خوا لێی ڕازی بێت ) فەرمووە: {إِنَّ فِيكَ خَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ: الحِلْمُ، وَالأَنَاةُ} واتە :تۆ دوو ڕەوشتی جوانت تێدایە کە خوای گەورە ئەم دوو ڕەوشتەی خۆش دەوێت :نەرمونیانی و لەسەرخۆی)،مەبەستی پێغەمبەری خوا ( دردو سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت ) بەهۆی بوونی ئەم دوو ڕەوشتە جوانە لە تۆدا خوای گەورە تۆی خۆشدەوێ، کەوابێت ئەم

فەرمووده ئاماژەیەکە کە نەرم و نیانی و لەسەرخۆی هۆکاری دەستەبەرکردنی خۆشەویستی خوای گەورەیە.

٢- کەم ئاخاوتن، پێکەنین،دەنگ بەرزکردن کەسایەتی مرۆڤ بەرز دەکەن لە بەرامبەریشدا ئاخاوتن و پێکەنینی زۆر و دەنگ بەرز کردنەوە ڕەوشت و ئاکاری نەویستراون. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆز دەنگی بەرزی داوەتە پاڵ گوێ درێژ،وە هەروەها هۆکاری دوورکەوتنەوەیە لە پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی دوایی هەروەکوو جابر لە پێغەمبەری خوا دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت {إنَّ مِنْ أَحَبِّكُمْ إِلَيَّ وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَحْسَنُكُمْ أَخْلاقًا ، وَإِنَّ أَبْغَضَكُمْ إِلَيَّ وَأَبْعَدَكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ الثَّرْثَارُونَ الْمُتَشَدِّقُونَ وَالْمُتَفَيْهِقُونَ " قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ ، قَدْ عَلِمْنَا الثَّرْثَارُونَ و الْمُتَشَدِّقُونَ ؟ وما الْمُتَفَيْهِقُونَ قَالَ : " الْمُتَكَبِّرُونَ " . } رواه الترمذي و صححه الالباني

إنَّ مِنْ أَحَبِّكُمْ إِلَيَّ وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَحْسَنُكُمْ أَخْلاقًا ، وَإِنَّ أَبْغَضَكُمْ إِلَيَّ وَأَبْعَدَكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ الثَّرْثَارُونَ الْمُتَشَدِّقُونَ وَالْمُتَفَيْهِقُونَ " قَالُوا : يَا

واتا :خۆشەویسترینتان و نزیکترینتان لەمن لە ڕۆژی دوایی ئەو کەسانەن کەخاوەنی رەوشتی بەرزن ،وە ئەوانەی کە زۆرترین رقم بەرامبەریان هەیە و دوورن لەمن لەڕۆژی دوایی کەسانێکن کە زۆر قسەدەکەن و ئازاری خەڵك دەدەن وە لوت بەرزن.

٣- هاوڕێیەتی کردنی کەسانی لەخواترس ڕەوشت بەرزو ژیرو بەئەمەك ،هەڵبەتە هاوڕێ کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر هاوڕێ هەیە ئەوەتا عائشە( خوا لێی رازی بێت )لە پێغەمبەری خوا ( درود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی {الْمَرْءُ عَلَي دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلْ} رواه أبو داود

واتە :مرۆڤ لەسەر ئاینی هاوڕێ و هاودەمیەتی ،باهەر یەکێك لەئێوە بزانێت کێی خۆشدەوێت.

٤- ڕێزگرتن لە ڕاوبۆچوونی بەرامبەر و خۆپاراستن لەڕەخنەگرتن وهەست بریندارکردنی هاوڕێیەکانمان ، باشتر وایە چاك کردنی هەڵەکان بەشێوەی تێك هەڵکێشان بێت .

٥- دوور کەوتنەوە لە خۆهەڵکێشان وخۆ بەگەورەزانین و ڕوو وەرگێڕان لە خەڵك ،ئەمە فرمایشتی پەروەردگاری مەزنە هەروەك لەسورەتی لوقمان فەرموویەتی {وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ (18)} واتە :بەفیزەوە رووت وەرمەگێڕە لەخەڵکی وە ڕووت گرژ مەکە،بەڵکو هەردەم ڕوو خۆشبە وە بەدەعیە و فیز مەڕۆ بەسەر زەویدا،بەڕاستی خوای گەورە دەعیە باز و شانازی کارێکی بەخۆ خۆشناوێت.

٦- یارمەتی دانی هاوڕێیەکانمان و بەهاناوە چوونیان لەکاتی تەنگانە درێژکردنی دەستی یارمەتی بۆیان لەکاتێکدا پێوستیان بەیارمەتی هەبێ ، ئەبوو هریرە لە پێغەمبەری خوا دەگێڕێتەوە {مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَي مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ} رواه ابوداود و الترمذي و ابن ماجه.

واتە :هەرکەسێك مەینەتیەك لەسەرکەسێك لابدات،خوای گەورە مەینەتیەك لە مەینەتیەکانی لە ڕۆژی دوایی لەسەر لادەبات

،وههرکهسێك ئاسانکاری بۆخهڵکانێك بکات خوای گهوره لهدونیاو لهرۆژی دوایی ئاسانکاری بۆدهکات.

٧- قوتدانهوهی ڕق و توڕهیی ،زاڵ بوون بهسهر خۆمان بهتایبهتی لهکاتی توڕهیی زۆر ،ئاشکرایه مرۆڤ لهکاتی توڕه بوون نیوهی ژیریی خۆی له دهست دهدات بۆیه ئهنجامدانی ههر کارو کردهوهیهکی نادروست و ناهاوسهنگ دهردهچێت و پهشیمان بوونهوه بهدوای خۆیدا دههێنێت، قوتدانهوهی ڕق و توڕهیی لهکاتێکدا کهدهتوانین دهریخهین پاداشتهکهی بریتیه له دهستبهرکردنی لێبوردهیی پهروهردگاری مهزن وبهههشت و چوون بۆ نێو بازنهی کهسانی چاکه خواز ئهوهتا پهروهردگار له سورهتی ال عمران دهفهرموێت{وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ( 133 ) الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ.( 134 )} واته: پهله و چهسپانی بکهن بو کردنی ئهو شتانهی دهبنه هۆی لێبوردهیی پهروهردگارتان وه چوونه بهههشتێکی فراوانی وا که پانتاییهکهی بهئهندازهی ئاسمانهکان

و زەوییە،کە ئامادەکراوە بۆکەسانێك کەلەخۆشی و ناخۆشی و لە بوون و نەبووندا ئەبەخشن،وە رق و تووڕەیی خۆیان دەخۆنەوە و لە هەڵەی مرۆڤەکان دەبوورن و تۆڵە ناسێنن، پەروەردگاریش خێر خوازانی خۆشدەوێت.

٨ - دوور کەوتنەوە لە تانە و تەشەرو توڕەکردنی هاوڕێیەکا نمان ،چونکە ئەم جۆرە کردەوانە جگە لەوەی هاوڕێیەکا نمان توڕە و بێ تاقەت دەکات ،تاوانێکە ئە نجامدەرانی توشی سزایەکی سەخت دەکات لە ڕۆژی دوایی ، خوای گەورە لە سورەتی الاحزاب فەرموویەتی : { وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا( 58 )} . واتە :ئەو کەسانەی کە پیاو و ئافرەتە باوەڕدارەکان ئازار دەدەن بێ ئەوەی هیچ گوناهێکیان هەبێت ،بێگومان ئەوانە بوختان و درۆ و گوناهی ئاشکرایان هەڵگرتووە.

٩- پاراستنی چاو لەسەیر کردنی ڕەگەزی بەرامبەر،دیارە ئەم ڕەوشتە بەرزە یەکێکە لەسیما جوانەکانی بڕواداران،وپاراستنی

دڵە لە تیرە کوشندەکانی شەیتانی نەفرەتلێکراو، ودەستبەرکردنی نورو ڕوناکیە بۆ دڵ، هەروەها جێبەجێکردنی فەرمایشتێکی بەرزی پەروەردگارە ، ئەوەتا خوای کردگار لە سورەتی نور دەفەرموێت { قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ (30) وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ.......... } واتە :ئەی محمد( درود و سڵاوی خوای گەورەی لێبێت )بە پیاوانی برۆادار بلێ چاو بنوقێنن لەئاستی ژنانی نامەحرەمدا ،ومداوێن و عەورەتی خۆیان بپارێزن بێگومان ئەوە باشرە بۆیان پەروەردگاریش ئاگادارە بەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن، وەبەژنانی باوەردار بلێ باچاویان دابخەن لەسەیرکردنی نامەحرەم........

پێغەمبەری خواش ( درودو سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت )ئامۆژگاری پێشەوا علی کوڕی ئەبی تالیب دەکات ودەفەرموێت ((يَا عَلِيُّ لَا تُتْبِعْ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ فَإِنَّ لَكَ الْأُولَى ، وَلَيْسَتْ لَكَ الْآخِرَةَ)) رواه ابو داود .

واتا (( واتا ئەی عەلی بە دوای سەیرکردنی نامەرحرەم مەکەوە سەیرکردنی یەکەم بۆ تۆیە بەڵام دوبارە و سێ بارە سەیرکردن بۆ تۆ نییە و گوناهبار دەبیت ))

ئەحمەد شەوقیش لەدێرە شعرێکدا جوانی وتووە:

نظرة فابتسامة فسلام......... فكلام فموعد فلقاء

واتا( سەرەتا سەیرکردنە، بە دوایەوە زەردەخەنەیەکە، ئینجا سەلامێکە، پاشان قسەکردنێکە، پاشان دانانی مەوعیدێکە بۆ دانیشتن )

١٠- خۆ پاراستن لە ڕاوەستان و پیاسە کردن و گاڵتە کردن لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەر، هەڵبەتە ئەم جۆرە کردەوانە جگە لەوەی کەسایەتی دادەبەزێنت و گومانی خرا پیش لەدڵی هاوڕێەکانمان دروست دەکات، تەنانەت ئەگەر بۆ قسەی چاك و ئامۆژگاری بەسودیش بێت ، مەگەر حالەتێکی زۆر پێویست بێت وکاتی کەمی گەرەك بێت ، باشتر وایە خوشکان دووان یان زیاتر بن .

١١- باشتر وایه گه نجەکان سونەتی سلام کردن و تەوقە کردن لە نێوان خۆیاندا پیادە بکەن ، کچەکانیش بە هەمان شێواز .

پێغەمبەری خوا (دردو سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت) بەلای کۆمەڵێك ئافرەت دا تێپەڕیوە و سەلامی لێ کردون .

١٢- بەرجستە کردنی صبرو ئارامی بەرامبەر هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرە و ئازار و ناخۆشیانەی دێنە ڕێگامان لە قۆناغەکانی خوێندن ، چونکە صبرو ئارامی ڕێگای تاریك ڕ ۆشن دەکاتەوە ، هەروەها دەبێتە دەستبەرکردنی پاداشتێکی بێ هەژمار، هەروەکو ابو مالکی الاشعری لە پێغەمبەری خوا دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی((الصَّبْرُ ضِيَاءٌ)) أخرجه مسلم في صحيح. واتا (ئارامگرتن ڕۆناکیە)

١٣- فرمان بەچاکەو نەهی کردن لەخراپەکاری ئەرکێکی شەرعیە بەسەر هەموو تاکێکی موسڵمانی باوەڕدار، بەڵام نەرم نیانی و حیکمەت و ئامۆژگاری چاك ئەرکێکی تری ئەم ئاکارەیە ، خوای گەورە لەیەك ئایەت ئەم دوو فرمانەی ئاراستە کردوین کە

دەفەرموێت{ادْعُ إِلَي سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ } النحل ١٢٥ .

واتا (ئەی پیغەمبەر ئەی باوەرداران هەر بە ژیرانە و نەرمی و قسەی خۆش و حیکمەت و ئامۆژگاری شیرین و جوان خەڵك بۆ ڕێگای پەروەردگارت بانگ بکە بەراستی پەروەردگاریشت باشتر بە کەسانێك دەزانێت کە لە ڕێگای ڕاست لایانداوە وە زاناتریشە بە حاڵی ئەو کەسانەی ڕێنوێنن لەسەر ڕێگای ڕاست )

١٤- خۆ پاراستن و دوورکەوتنەوە لە هەر شتێك کە پەیوەندی بەئێمەوە نییە ، پێوست بە پرسیار کردن لە تایبە تمەندی کەسێك یان کێشەیێك کە خاوەنەکەی ئارەزوو ناکات باسی لێوە بکات ، پێغەمبەری داناما ن ئەو ڕەوشتە بەرزەی بەڕەوشتێکی جوان بۆ موسڵمانان وەصف کردوە و دەفەرموێت ((مِنْ حُسْنِ إِسْلامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لا يَعْنِيه )) رواه الترمذي و غيره

واتا ( له جوانیەکانی ئیسلام ئەوەیە مرۆڤ واز لە شتێك بهێنێت که پەیوەندی بە خودی خۆیەوە نییە ).

١٥ ـ پێویستە خۆمان بپارێزین لەسەرجەم ئە و ڕەفتارو گوفتارو کردەوانەی کە مایەی دروست کردنی گومانی خراپن لەسەرمان،وەك دانشتن لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەر لە باخچە بە تەنها و شوێنە لا چە پەکان یان چوون بۆ ژووری مامۆستا بە تەنها لە کاتێکدا ئەو لە ڕەگەزی بەرامبەرە ، عمری کوڕی خەتاب ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت دەفەرموێت کردەوەێك ئەنجام مەدە کە دەبێتە مایەی دروست بوونی گومان لەسەرتا ، پاشان گلەیی مەکە ئەگەر گومانی خراپ لەسەرتا دروست بوو .

١٦- پێوستە دڵ بپارێزرێ لە گومانی خراپ بەرامبەر هاوڕێ و مامۆستاکان ، چونکە گومان فێڵێکی شەیتانە و تووشی گوناهمان دەکات ، بۆیە پەروەردگاری زاناو حەکیم فرمانی پێ کردوین بەووشەی اجتناب واتە دوور کەوتنەوەی تەواو ، دیارە گومانی خراپ سەرەتایەکە بۆ دروست بوونی کوشتن و فتنە و شەڕ و ئاژاوە،

پەروردگار لە سورەتی حجرات کە بە سورەتی ڕەوشت ناونراوە دەفەرموویت{يـأَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ ... ١٢} واتا (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هیناوە خۆتان لە زۆرێك لە گومانبردن بە یەکتری بە دور بگرن چونکە هەندێك لەو گومانانە مایەی دووچاربونتانە بە گوناە لای خوای گەورە )

١٧- پێوستە کێشە کان بچووك بکەینەوە ، لەکێشەش کێشە دروست نەکەین ئەگەر کێشەیەك بەرۆکی گرتین لەخوا بپارێنەوە ،و هەوڵ بدە ین بە یار مەتی هاورێ و کەسانی دڵسۆزو بە ئەزموون ڕێگاچارەیەکی گو نجاوی بۆ بدۆزینەوە .

١٨- پێویستە گرنگی بەسەرجەم وانەکان بدەین ، هەوڵ بدەین یەکێك بین لە قوتابیە زیرەك و نموونەیەکان ، ئەگەر وانەیەك بەلامانەوە گران بوو گرنگی زیاتری پێ بدەین و کاتی زیاتری بۆ تەرخان بکە ین، وە داوای زیاتر شیکردنەوە لە مامۆستا و هاو پۆلەکان کارێکی ئاساییە .

ابو هريره له پێغەمبەری خواوه (دوردی خوای لەسەر بێت) دەگێرێتەوه كه دەفەرموێت (احرص علي ما ينفعك واستعن بالله ، ولا تعجز ) رواه مسلم . واتـا ( پێداگربه لەسەر هەموو ئەو شتانەی كه سودیان هەیه بۆت وه بۆ ئەمەش داوای هاوكاری و پشتیوان له پەروەردگار بكه و هەرگیز دەستەو ئەژنۆ مەوەسته )

١٩- هەوڵ بدەین پێش ئەوەی بچین بۆ كۆلێژ دەست نوێژ هەڵگرین،وه لەگەڵ خوێندنی وێردەكانی بەیانیان وەك چوونه بۆ نێو قەڵایكی پارێزەر،خوێندنی وێردەكانی دەستبەركردنی پارێزەریه لەلایەن فریشتەكانەوه بەفرمانی پەروەردگار ،با لێوەكانمان هەردەم تەڕ بێت به یادی خوا ، هەڵبەته هەر كارێكیش پەروەردگار فرمانی پێ كردبێت دڵنیابه سوودی زۆری بۆ خاوەنەكەی هەیه، وه خوای گەوره له سورەتی الاحزاب دا دەفەرموێت{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا (41) وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا (42} ، واتـا (ئەی ئەو كەسانەی باوەرتـان هێناوه یادی خوا بكەن یادێكی زۆر و بێسنور وه هەموو بەیانی و

ئێوارەیەك خوا بە پاك و خاوێن رابگرن وە هەردەم تەسبیحات بکەن )

٢٠- لە ناخی دڵمان پشت بە خوای باڵا دەست ببەستین خوا بەسە لە گەڵمان بێت پەروەردگار لە سورەتی الطلاق دەفەرموێت{وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَي اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا 3} ، واتا ( هەر کەسێك پشت بە خوای باڵا دەست ببەستێت دوای گرتنەبەری هۆکارەکان ئەوە تەنیا خوای بەسە و کار و باری بۆ ئاسان دەکات بێگومان هەرچی خوا برپیاری لەسەربێت هەر ئە نجامی دەدا و دەیگەیەنێتە جێ وە بەراستی بۆ هەموو شتێك خوای گەورە کات و ئەندازەیەکی دیاری کردوە )

٢١- هەرگیز لە رەحمەتی خوای باڵا دەست نائومێد نەبین چونکە رەحمەتی خوای گەورە هەموو شتێکی گرتۆتەوە چ جای تۆی موسڵمان هەروەکو لە سورەتی الاعراف پەروەردگار ئەم ئومێدە گەورەیەی پێ بەخشیوین( وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ... ١٥٦ ) واتا ( رەحمەت و بەزەیی بەرفراوانی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە )

٢٢- پاڕانەوەی بەردەوام و ،بوونی هەستی چاودێری پەروەردگاری باڵا دەست بەسەرمانەوە ،و پاراستنی فرمانەکانی خوای پەروەردگار هۆکاری بەهێزن بۆپاراستنمان لە لایەن کردگارەوە ، پێغەمبەری خوا (درودو سڵاوی خوای لێ بێت ) ئامۆژگاری ئامۆزا بچوکەکەی( عبدالله کوری عباس ) کردو پێی فەرموو:(( يَا غُلَامُ إِنّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتِ احْفَظْ اللَّهَ يَحْفَظْكَ )) رواه الترمذي و قال حديث حسن صحيح، واتا (ئەی بچکۆڵ من فێری چەند وشەیەکت دەکەم دەستیان پێوەبگرە فرمانەکانی پەروەردگار بپارێزە پەروەردگاریش تۆ دەپارێزێت .

٢٣- باشتر وایە کاتەکانمان بە م شێوەیە دابەش بکەین :-



٢٤- ئامادەکردنی ئەرکی ڕۆژانە یەکێکە لە سیما جوانەکانی قوتابی سەرکەوتوو، هەرگیز ڕێگا نەدەین واجبەکان لەسەرمان کۆ بێتەوە ،ئەو وانانەی کە مامۆستاکانمان ڕونیانکردۆتەوە ،ئەوەی کە لە تێنوسەکە نووسیومانە لە ماڵەوە دوای حەسانەوە جارێکی تر بگەڕێنەوە سەری ، چونکە ئەمە یارمەتیدەرێکی چاکە بۆ گواستنەوەی زانیارییەکان لە یادگای کاتی و جێگیرکردنی لە یادگای هەمیشەیی .

٢٥ - هەوڵ بدەین لەکاتی ڕوون کردنەوەی وانەکان تەرکیزی تەواو بکەین چونکە تا تەرکیز زیاتر بێت زانیاریەکان باشتر وەردەگریت و ماوەیەکی زیاتر لە یادگا دەمێنێتەوە ، وبە تەنها پشت نەبەستەین بەگوێ گرتن لە مامۆستاکانمان چونکە ،ئەو زانیارییەی تەنها جارێك دەبیستیت دەچێتە یادگای کاتی و بەشی زۆرمان لە بیر دەچێتەوە بەڵکو دوای سەرچاوەی زیاتر بگەڕێ لە پاڵ گوێگرتن لە مامۆستا .

کۆمەڵێك ئاداب و ڕەوشتی جوان هەن کە پیادەکردنی پێویستە لە نێو هۆڵەکانی خوێندن :

١- گوێ گرتن لە مامۆستا خۆ خەریك نەکردن بە شتی بێ سوود و لا بەلا .

٢- خۆ ڕاهێنان لەسەر نووسینی زانیاریە گرنگەکان بە خەتێکی خۆش ، بە تاقی کردنەوە دەرکەوتووە یەکجار نووسین بە قەد هەشت جار خوێندنەوەیە .

٣- گفتو گۆ نەکردن لەگەڵ هاوپۆلەکانمان ، ئەگەر ئەویش پرسیاری کرد هەوڵ بدەین بەنووسین زۆر بەکورتی وەڵامی بدەینەوە یان ئاماژەی بۆ بکە کەتۆ دەتەوێت گوێ بگریت .

٤- واز هێنان لە مشتومڕ کردن و ڕەخنە گرتن لە مامۆستاکانمان ، ئەگەر دڵنیا بووین لە زانیاریەکی هەڵەی مامۆستا ، باشتر وایە بە شێوەی تێك هەڵکێشان بۆی چاك بکەینەوە.

٥- له ماڵەوه تەواو خۆمان ئاماده بکه ین،بەشداری چالاکی ڕۆژانەمان هەبێت،ئەگەر مامۆستایەك بەتەنها خۆی وانەکانی ڕوون دەکردوه ، هەوڵ بدەین زانیاری سەرتا یمان لەسەر بابەتەکە هەبێت ، جونکه ئەمه یارمەتیدەرێکی چاکه بۆ باش تێگەیشتن بەشێوەیەکی ئاسان .

٦- له کاتی تاقی کردنەوەکان هەرگیز بیر یان هەوڵی گزی کردن نەدەین ،چونکه گزی کردن جگه لەوەی له کەسایەتیمان کەم دەکاتەوه ،بیرکردنەوەش پەرش و بڵاو دەکاتەوه، لەلایەکی تر قەدغەیه ، پێغەمبەری ئازیزمان (درودو سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت دەفەرموێت ( من غش فليس منا ) رواه مسلم، واتا ( ئەوەی فێڵ بکات له ئێمه نییه )

٧- خۆ پاراستن له سەیرکردنی مامۆستا بەچاوێکی کەم، تانەو تەشەره لێدان و غەیبەت کردنی پاشەمله ، وەك ووتراوه هەرکەسێك پیتێکم فێر بکات باوکمه بەدرێژایی تەمه نما .

٨- ئامادەی سەرجەم وانەکان بین ، مەگەر پێش هاتێك بێتە پێشمان لە توانای ئێمە بەدەر بێت ،هەڵبەتە ئە مە نیشانە ی پێداگری و زیرەکیە ،

٩- لە خوێندن بێ تاقەت نەبین ، بەڵکو بە خوا پەرستی و ڕێگای بەهەشتی بزانین ، ئەوەتا پێغەمبەری خوا (درود سڵاوی خوای لێ بێت دەفەرموێت ) ( من سلك طريقاً يلتمس فيه علماً سهل الله له به طريقاً إلي الجنة ) رواه مسلم، واتا ( هەرکەسێك ڕێگایەك بگرێتە بەر لەم ڕێگایەدا زانستێك فێربێت پەروەردگار ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات )

١٠-پشووەکان دەرفەتێکە بۆ فێر بوونی ئەو شتانەی کە هاوڕێیە کانمان دەزانن و ئێمە نایزانین وەك پیشەیەك چونکە بە تەنها بڕوانامە بەس نییە بۆ گەنج بەڵکو هەوڵی فێربونی پیشەیەکی گونجاو بدەین چونکە زۆریك لە گە نجان دوای دەرچونیان لە کۆلێژ کاریان دەست ناکەوێت چونکە ئەمانە تەنها خاوەنی بڕوانامەن کە بڕوانامەش بەس نییە بۆ دۆزینەوەی دەرفەتی کار .

١١- هەوڵ بدەین بۆ گرتنەبەری هۆكارەكان لە سەرجەم قۆناغەكانی خوێندن دوو زمانی تر بە تایبەتی هەردوو ز مانی عەرەبی و ئنگلیزی فێر بین ، چونكەتەنها بڕوانامە بەس نییە ، بەڵكو فێر بوونی زمان یەكێكە لە پێداویستیەكانی سەردەم ، زاناكان دەڵێن ئە گەر تۆ دوو زمان بزانیت وەك ئەوەیە كە تۆ دوو كەسیت گەر سێ بێت دەبیت بەسێ كەس .

١٢- با تەكنەلۆژیا لە خزمەت ئێمە دابێت بۆ كاری بەكەڵك سوودی لێ وەربگرین ، هەرگیز رێگا نەدەین تەكنەلۆژیای سەردەم ژیان و كاتمان داگیر بكات بەرەو شتی بێ سوودو بێ مانا ڕامان كێشێت .

١٣- لە بەركردنی جل و بەرگی شیاو گونجاوو شەرعی یەكێكە لە سیما جوانەكانی مرۆڤی موسڵمانی بڕوادار، بە تایبەتە بۆ خانمان ،هەروەكوو پەروەردگار لە سەرەتی الاعراف دەفەرموێت{وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ......٢٦} واتا ( پۆشینی جلوبەرگێك كە سیمای لە خواترسی لە خۆگرتبێت باشتر و خێردار ترە بۆتان )